# پوختەیەك لەو فیتنەیە کە شێخ عبدالله المهاوش دروستیکردووە

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وأصحابه ومن اهتدى بهداه. أما بعد:

چەند ڕۆژێکە شێخ عبدالله المهاوش -خوای گەورە ئیصلاحی بکات- دەستی داوەتە نانەوەی فیتنەیەك و کردنەوەی دەرگایەکی خراپ بۆ سەر دەعوەی سەلەفی لە کوردستان و عێراق؛ بە پێویستم زانی کە بە کورتی باسی ئەو فیتنەیە بکەم.

سەرەتا:

مەعلومە کە پێش دانیشتنەکانی چەمچەماڵ هەندێك لە مەشایخی رضوانیە بە ئاشکرا و بەڕاستەوخۆیی تەحذیریان لە ماموستایانی کوردستان دەکرد، بەڵام لە دانیشتنەکانی کۆتاییدا شێخ سعد النایف هاتە ناو دانیشتنێك و بەر لەهەموو شتێك وتی: من داوای لێبوردن دەکەم کە تەحذیرم کردووە، هەڵەبووم و، داوای گەردەن ئازادی دەکەم.

بەڵام دوای ماوەیەکی تر دووبارە و چەندبارە دەستیان کردەوە بە تەحذیرکردن، ماوەی چەند ساڵێکە کۆمەڵێك مەشایخی رضوانیە لەسەر کۆمەڵێك قسەی ناڕاست و ناڕەوا تەحذیر لەم ماموستایانە دەکەن، بەتایبەت شێخ عبدالله المهاوش کە چەند ساڵێکە دەستیکردووە بە تەحذیرکردن و تانەدان بە شێوازێکی ناڕەوا و ناشرین -دوور لە ئادابی طلاب العلم-.

ماموستایان لەبەر مەصلحەتی دەعوەکە بێدەنگی و ئارامیان هەڵبژارد، بەڵام سەبر و ئارامی سنوری خۆی هەیە، بەداخەوە شێخ عبدالله المهاوش سنوری تەحذیر و ئادابی تەحذیرکردنیشی بەزاند.

پێش دوو مانگ ماموستا عبدالکریم قەیتولی نامەی شێخ عبدالله المهاوش نارد؛ بۆ ئەوەی نەصیحەتی بکات و پێی فەرموو: ئایا تەقوای خوای گەورە ناکەن؟ هەرکەسێك دێتە لاتان و پرسیاری ئێمەتان لێدەکات ئیللا بە خراپترین شێوە تەحذیرما لێ دەکەیت؟ بە پشتیوانی خوای گەورە ئەم بابەتە لەسەرتان بەرز دەکەینەوە بۆ لای زانایان.

شێخ عبدالله المهاوش كە عادەتی خۆی و غەیری خۆیشی وایە ڕاستەوخۆ دەست دەكەن بە: نصيحتي لك ولإخوانك...

تێدا كۆمەڵێك قسەی بێ بنەمای كرد و بەردەوامبوو لە قسە فڕەدان وئیتهامكردن و بەبێ گوێگرتن!.

پاشان مامۆستا عبدالكريم وەڵامی دانە بەدانەی قسەكانی دایەوە و، ئیتهامەكانی پوچەڵكردەوە، بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر قسە فڕەدان و گوێنەگرتن!.

پاشان گەیشتنە ڕێككەوتن كە بچنە لای شێخ عبدالله البخاري و دابنیشن.

بەڵام عبدالله المهاوش پابەندنەبوو بە بەڵێنەكە و وەعدی خۆی شكاند و، دەستیكردەوە بە تەحذیركردن، تەحذیركردنێك زۆر خراپتر و ناشرینتر و، قێزەوەنتر لە تەحذیرەكانی تر، دوور لە ئادابی شەرعی بۆ عامەی خەڵكی، وە دوور لە ئادابی تایبەتی طلاب العلم.

**تێبینی: پێش ئەوەی بچینە سەرقسەكانی شێخ عبدالله المهاوش چەند خاڵێك كە گرنگە بیزانین:**

یەكەم: جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو نامە دەنگیانەی كە شێخ المهاوش بڵاویكردتەوە بەناونیشانی: (حقيقة نصيحة الشيخ عبدالله المهاوش لعبدالكريم القيتولي) لەگەڵ ئەو چەند نامە دەنگیانەی كە (مسربة) كە تێیدا: تەبدیع و جنێو و شتم و قسەی نەشیاو دەكات!.

دووەم: كێشە و ترسناكی ئەم فیتنەی كە عبدالله المهاوش دروستیكردووە لەوە دایە كە بەناوی شێخ ربيع قسە دەكات!، وە قسەی گیرفانی خۆی دەداتە پاڵ شێخ ربيع!، تەنانەت قسە دەداتە پاڵ شێخ ربيع و لا يزال دووبارەی دەكاتەوە!.

سێیەم: شێخ عبدالله المهاوش سەرەتا دەستیكردووە بە تەحذیركردن، هەركەسێك چووبێتە لای ئیللا باسی مامۆستایانی كردووە!. -والبادي أظلم-!

چوارەم: ئەوان زۆر باسی حیکمەت، نەصیحەت، ئاداب، مەصلەحە و مەفسەدە دەکەن، بەڵام هیچ ناکێت نەهاتوون بڵێن: ئەوەتان هەڵەیە، یەك، دوو، سێ. بەڵکو تەنها بە مجمل دەڵێن: توندن، بێ حیکمەتن، دەعوەی سەلەفی ناشرین دەکەن....هتد، چەند ئیتهامی تر کە هەموو کەسێك دەتوانێت ئیتهامات فڕە بدات، بەڵکو نەك تەنها ئیتهام بگرە درۆیشی تێکەوت!.

پێنجەم: دەڵێن: چەند ساڵە نەصیحەتیان دەکەین!. ئەمە درۆیەکی شاخدارە، چەندین جار مامۆستا عبدالکریم قەیتولی چۆتە لای شێخ سعد النایف، پێی وتووە: چیتان هەیە لەسەرمان بیڵێن، بەڵام ئەو هەر دەیوت هیچتان لەسەر نیە!، لە ژێرەوەش تەحذیری دەکردا. بەمشێوەیە دەعوە و حیکمەت و مەصلحەتمان پێ دەفرۆشنەوە؟!

## تۆمەت وقسە نەشیاو و حوکمە باتڵەکانی شێخ عبدالله المهاوش:

1- تەحذیرکردن لە مامۆستایانی سەلەفی بەخراپترین شێوە!.

2- تەبدیعکردن و وەسفکردنی مامۆستایان بەوەی لەسەر ڕێگای (غلاة الحدادیة)ن!.

3- اتهامی مامۆستایان دەکات بە توندی، بەڵام تاکو ئێستا بەڵگە ناهێننەوە کە لەسەرچی توندین و لەگەڵ کێ توندین؟! لەبەرچی توندین -ئەگەر توندین-؟

لەکاتێکدا خۆی بەتوندترین شێوە تەحذیر دەکات!، طبعا بەبێ بەڵگە و نەصیحەت!.

4- بەناوی شێخ ربیعەوە قسە دەکات و دەڵێت: ئەو ڕێگایەی ئێوە لەسەرینە شێخ ربیع لەسەری نیە!.

5- ئێوە حیکمەتتان نیە.

بەڵام خۆی لەوپەڕی حیکمەتدایە کە بەبێ بەڵگە تەبدیع و تەحذیر دەکات.

6- ئێوە تعجل و پەلەپەل دەکەن.

لەکاتێکدا خۆی بەڵێنیدا کە لەگەڵ مامۆستا عبدالکریم قەیتولی بچێتە لای شێخ عبدالله البخاری دابنیشن، بەڵام لەبەر تعجل و بێ حیکمەتی خۆی، صبری نەما و خراپتر لە جاران تەحذیر و تەبدیعی کرد!.

7- ئیتهام دەکات و دەڵێت: ئێوە قسەتان لەسەر عبداللطیف کرد و تەبدیعتان کرد پێش ئەوەی شێخ ربیع قسە بکات، لە کاتێکدا شێخ ربیع دەیفەرموو قسە لەسەر عبداللطیف مەکەن!.

ئەمە درۆیەکی شاخدارە بەناوی شێخ ربیع، کەس پێش شێخ ربیع عبداللطیفی تەبدیع نەکردوە، وە شێخ ربیع هیچ کاتێك ئینکاری لە مامۆستایان نەکردووە لە ڕەد نەدانەوەی مامۆستایان بۆ هەڵە ئاشکراکانی عبداللطیف، وە لە مەنهەجی سەلەفی نیە کە هەڵەی ئاشکرا بە ئاشکرا ڕەدی نەدرێتەوە!، شێخ ربیع یش لەسەر هەمان مەنهەجی سەلەفی دەڕوا کە هەڵەی ئاشکرا بە ئاشکرا ڕەد دەدرێتەوە.

8- دەڵێت: ئێوە بە فەخر و شانازیەوە باسی ئەوە دەکەن کە پێش زانایان عبداللطیفتان تەبدیع کردووە، ئەمەش تقدم بین یدی العلماء.

ئەم قسەیە بوهتانە و هیچ ئەصل و ئەساسی نیە!.

9- ئێوە هەردەڵێن: شێخمان ربیع، شێخمان ربیع، بەڵام تەنها دەعاوایە (بانگەشەیە)، ئەوە مەنهەجی شێخ ربیع نیە.

10- دەڵێت: ئێوە ئەوەندە ناوی شێخ ربیع دەهێنن و قسەی دەهێننەوە ، کەسێك نەتان ناسێت دەڵێت: ئەوانە بەردەوام لەگەڵ شێخ ربیع بوونە!.

شێخ المهاوش وەك فەخر و بەکەم دانانی مامۆستایانی تر دەڵێت: من 12 ساڵ ملازەمەی شێخ ربیع م کردووە، بەڵام ئێوە لای کێ خوێندوتانە...

لە وەڵامیدا مامۆستا عبدالکریم قەیتولی فەرمووی: واز لەو خۆبەگەورەزانین و بەکەمدانانی بەرامبەر بێنە، ئەوەش مەنقەبەیە بۆ ئێمە کە زۆر وتەکانی شێخ ربیع باس دەکەین، ئایا حەددادیت بینیوە ئەوەندە باسی شێخ ربیع بکات؟

11- دەڵێت: ئەوانە عەصابەن، ئەحمەقن، جاهلن، تێناگەن، عەقلیان نیە، طحالبن (قەوزە و پیسن!). دەڵێتن: أوطی (واطي: جنێوێکی پیسی بازاڕیە، لە سعودیە کەسێك لەسەر ئەم قسەیە 5 جەلدی لێدراوە).

ئەمە زمان و ئەدەبی قسەکردنی شێخی گەورە عبدالله المهاوش ە، کەچی ئیتهامی مامۆستایان دەکات بە بێ ئەدەب و بێ حیکمەت و صغار!.

12- ئیتهامی مامۆستا سیروان دەکات و دەڵێت: ڕەدی شێخ سعد النایف ی داوەتەوە لەسەر جیاوازیکردن لە نێوان (عەقیدە و مەنهەج). دەڵێت: قسەم لەگەڵی کردووە -واتە لەگەڵ مامۆستا سیروان- وتەی زانایانم باسکردووە بەڵام تێناگا!.

ئەم قسانەی المهاوش: لە ئەلیف تا کۆتایی هیچی ئەصل و ئەساسی نیە!. خەیاڵ یان خەونێکە بۆ خۆی دروستیکردووە، لەسەر ئەم شتە بێ بنەمایە حوکم و جنێو بە مامۆستا سیروان دەدات!.

پێشی وتراوە ڕاست نیە، ئەصلی نیە، ئەگەر ئەصلی هەیە: بێنە ڕەددەکەی مامۆستا سیروان!.

بەڵام ئەوا لایزال ئەم قسەیە دووبارە دەکاتەوە؛ چونکە عینادە و هەر قسەیەك فڕە بدات پێداگری لەسەر دەکات، ئەگەر دە جاریش بۆی دووبارە بکەیتەوە!.

13- دفاع له ماموٚستا جمعه دەكات كه لەگەڵ كەسێكی موبتەدیعی وەك عماد طارق دانیشتووە!، كەچی تەحذیر و تانه له ماموٚستا سیروان دەدات كه انكاری لەم دانیشتنه كردووە!.

له كوێی مەنهەجی سەلەفی هاتووە دفاع له كەسێك بكەیت كه لەگەڵ موبتەدیع دابنیشێت، له بەرامبەردا تەحذیر لەو كەسە بكەیت كه ئینكاری له دانیشتن لەگەڵ موبتەدیع بكات ؟!

ئەگەر ئینكار كردنەش توندی تێدابێت -بەگومانی خوٚت- ئەولاتره تەحذیر لەو كەسانه بكەیت كه لەگەڵ موبتەدیع دادەنیشن!. مەنهەجی سەلەفی بەمشێوەیە، شێخ ربیع یش ئاوا فێری كردووین له كتێب و وانه و محازرەكانی، نازانم توٚ 12 ساڵ مولازەمەی شێخ ربیع ت كردووە بوٚ موخالفەی دەكەیت و، دەشتەوێ ئەو موخالەفه كردنه بدەیته پاڵ شێخ ربیع؟!

14- به ماموٚستایان دەڵێت ضعیف في العلم، ضعفاء، كەچی بەشایەتی مشایخی رضوانیه له سوڵحی چمچماڵ وتیان ئێوە لەوان زوٚر به مستواترن له علم و أدب، كەچی دفاع لەوان دەكەن كه هەڵەی زەقیان هەیە، تحذیریش لەم ماموٚستایانه دەكەن!.

15- اتهامەمان دەكات كه پێش علماء كەوتووین، كەچی خوٚی: پێش علما تحذیر و تبدیع دەكا! وە پابەند نەبووە به گەڕانەوە بوٚ لای علماء! ئەمەش مخالفی اصولی منهجی سلفیه.

16- بەرگری له كەسانێک دەكات كه بونەته مایەی نانەوەی فیتنه، لەوانه عثمان احمد، به فیسبوكی نەخوازراو فیتنەی ناوەتەوە و قسەی به ماموٚستایان وتووە، پاش كەشف بوونی، بوٚ ڕەوایەتیدان به كارەكەی خوٚی قسەی زانایانی بڕیوە (بەتر) كردووە، دووبارە پاش كشف بوونی خیانەتی علمی و قەتعكردنی قسەی زانایان، تەوبەكی مجملی كردووە.

بوٚچی لەگەڵ كەسانی نەخوٚش ئاوا نەرم و ئاسانكاری و دفاع دەكەن، بەڵام لەگەڵ ماموٚستایان ئاوا به توندی مامەڵه دەكەن؟

17- دەڵێت: ئەوانه لەگەڵ صهیب العراقي چوونەته لای شێخ ربیع، شێخ ربیع بەوانەی وتووە ضعیفن!. (وقال الشیخ ربیع فیهم هؤلاء ضعفاء!).

هیچ كاتێك ئەو ماموٚستایانه لەگەڵ صهیب العراقی نەچوونەته لای شێخ ربیع!، نازانین كام لەم ماموٚستایانه (ماموٚستا عبدالكریم سلێمانی، ماموٚستا جمعه، ماموٚستا محسن) چووبوونه لای شێخ ربیع و وای پێگوتبوون!.

واته هیچ یەکێك لەو مامۆستایانە نەبوونە کە شێخ عبدالله المهاوش بەناوی شێخ ربیع دەڵێت: بەوانەی گوتوە ضعفاء!.

ئەو مامۆستا بەڕێزانە چەندین جار چونەتە لای شێخ ربیع و چەند هەڵەی عبداللطیف یان بۆ شێخ ربیع بردووە، هیچ جارێك نەی وت: ئێوە ضعیفن!.

وە لە چەمچەڵیش لەناو چەندین کەس مەشایخی رضوانیە بەتایبەت شێخ سعد النایف و ابو حارث المشهدانی وتیان: أنهم ضعفاء جدا في المنهج!. -مەبەستیان مامۆستا: جمعە و عبدالکریم و محسن...بوو.

18- بەناوی شێخ ربیع دەڵێت: ئێوە ڕەدی عبداللطیفتان داوەتەوە و پێش زانایان کەوتوون!.

ئەو مامۆستا بەڕێزانە چەند سەردانی زانایانیان کردووە، وە پێیان ڕاگەیاندوون کە لەنێوان ئەوان و عبداللطیف ڕەددانەوە هەیە، کەسیان نەیان فەرموو: ئێوە بۆ پێش زانایان دەکەون و ڕەد دەدەنەوە؟

کەی لە مەنهەجی سەلەفی بووە تەنها زانایان ڕەد بدەنەوە؟

ئەمە قسە کردنە بەناوی شێخ ربیع، ئەمە خیانەتە لە شێخ ربیع کە شتێك دەدەیتە پاڵی لە کاتێکدا ئەمە مەنهەجی ئەو نیە و وای نەوتووە!.

ئەگەر بە قسەکەی عبدالله المهاوش بکەین وەك تەنازولێك: باشە کێ لە زانایان بەتۆی وتووە: ڕەد بدەوە؟ تەحذیر بکە بە زوڵم؟ بێ ئەدەبی و قسەی نەشیاو و جنێو بدە بە مامۆستایان سەلەفی؟ -حاشا هیچ زانایەك و طالب علمێك ئەو قسەیە ناکات-.

ئەی شێخ عبدالله المهاوش بۆ پێش زانایان دەکەویت؟ یان پێشکەوتنی زانایان بۆ تۆ حیکمەتە؟ یان مەبەستت لە پێشکەوتنی زانایان نەفسی خۆتە!.

19- دەڵێت نەصیحەتیانم کردووە!. تێناگەن!.

هیچ ئەصل و ئەساسی نیە!، مامۆستا عبدالکریم نامەی بۆ ناردووە و نەصیحەتی شێخ مهاوشی کردووە کە واز لەو تەحذیراتە بهێنێت!. چونکە ئەو چەند ساڵە تەحذیر دەکات!، کەچی ئێستا شێخ المهاوش سوتەکانی خۆی بڵاوکردۆتەوە دەیەوێ وانیشانی بدا کە ئەو نەصیحەتی کردوون!، بەڵام نامە سوتیەکانت پاش تەحذیراتی چەند ساڵەیە کە مەشایخی

رضوانیه دەیکەن!، ئایا مەنهەجی سەلەف و زانایان ئەوەیە پاش تەحذیرکردن نەصیحەت بکەن؟!

-20 دەڵێت: ئەوانە بەس خەریکی ڕەددانەوەی سەلەفیەکانن، هیچ ڕەدیان نیە لەسەر صۆفی و حیزبیەکان!

دەبێت کەسێکی ڕاستگۆ هەبێت بڕوا بەم قسەیە درۆیە شاخدارە بکات؟ بەبێ عیلم چۆن قسە دەکەیت لەسەر مامۆستایان؟! ئەوانەی تۆ دفاعیان لێ دەکەیت کامیان هێندەی ئەو مامۆستایانە ڕەدی صۆفی و ئیخوانی و تەکفیریەکانی داوەتەوە؟!

ئەی شێخ المهاش ئەوانەی تۆ دفاعیان لێدەکەیت، هەندێکیان هێشتا یەکجاریش نەیانتوانیوە ناوی عبداللطیف بهێنن!، هەندێکی لا یزال کێشەی هەیە و تێناگات کە ئایا حیزبی هەجر دەکرێت یا نا ؟! -لەم بابەتە کێشەی هەبێت دەبێ بابەتی وردتر حاڵی چۆن بێت؟!-

-21 دەڵێت: ئەمانە طعن لە عرض و ناموسی سەلەفیەکان دەدەن!.

تانە و طعن لە عرضی کێ لە سەلەفیەکان دراوە؟

شێخ عبدالله المهاوش زۆر ئیتهام داوێت و بە زۆریش دەیەوێت بیکاتە ماڵ لەسەر مامۆستایان! بەڵگە بێنە تانە لە عرضی کێ دراوە؟!

بەڵکو ئەوانەی تۆ دفاعیان لێ دەکەیت، هیچ موقفیان نیە کە لەلایەن کەسە نزیکەکانی خۆیانەوە قسە بە عرض ی مامۆستایان دەدرێت!.

لە کۆتاییدا:

لەسەر تەحذیکردن و تەبدیعکردنی کەسی سەلەفی بەبێ بەڵگە، کاتێك بە شێخ عبید الجابري -رحمه الله تعالى- فەرمووی عبداللطیف بەبێ بەڵگە سەلەفیەکان تەبدیع دەکات و پێیان دەڵێت حەدادیە، فەرمووی: (ويل لمن كان خصمه السلفي يوم القيامة!).

وە شێخ عبدالله البخاري حفظه الله تعالى- فەرمووی: (أنا قلت لعبداللطيف اترك كلمة حدادي، حدادي، ما كل انتقدك تقول عليه: حدادي!).

له پێش شێخ عبدالله المهاوش کەسانی تری وەك عبداللطیف و ملا وریا و چەندین مامۆستایای تر، ئیتهامی ئەو مامۆستایانەیان کردووە بە حەدادی و بێ حیکمەت، بەڵام تاکو ئێستا کەسێك بەڵگەی نەهێناوەتەوە لەسەر حەدادیەتی ئەو مامۆستایانە، بەڵکو هەر ئەوان سەرەتا تەبدیع دەکەن، تەحذیر دەکەن، وشە و قسەی نەشیاو و بێ ئەدەبی بەکاردەهێنن!.

شێخ عبدالله المهاوش ئەگەر تۆ تەحذیر دەکەیت و ڕەد دەدەیتەوە بە بەڵگە و زانستیانە وەڵام بدەوە، نەك تەنها قسە فڕێ بدەیت، یان بە زۆر بتەوێت شتێك کە هیچ حەقیقەتی نەبێت بیکەیتە ماڵ لەسەر مامۆستایان، وە بۆشت ڕوون بکەنەوە کە ئەمە حەقیقەتی نیە، کەچی تۆ هەر سور بیت و عینادی بکەیت و بڵێیت: وایە!.

تۆ زۆر باسی علم و علماء دەکەیت، لە کوێی علم و علما هاتووە تەنها جنێو فڕە بدەیت؟ لە کوێی علم و علماء هاتووە حوکم لەسەر شتێك بینا بکەیت کە هیچ ئەصل و ئەساسی نەبێت؟!

خاڵێ کۆتایی: لایزال داوای بەڵگە دەکەین کە ئەم مامۆستایانە لە غولاتی حەددادی بن؟ وە مامۆستا سیروان کەی ڕەدی سعد النایف ی داوەتەوە؟ ڕەدەکە بهێننە، وە کەی شێخ مهاوش قسەی لەگەڵ م. سیروان کردووە لەسەر ئەم ڕەدە -وەهمیە-؟! قسەکان بهێنن!. وە کەی شێخ ربیع بەو مامۆستایانەی وتووە: ئەوان ضعیفن؟!

والله المستعان

ونعوذ بالله من الفتن ما ظهر منها وما بطن.